هۆنراوە بۆ منداڵان

# دڵخۆشم



بڕوا موحەممەدی



## هۆنراوە بۆ منداڵان

# دڵخۆشم

بروا موحەممەدی

١٤٣١ك – ٢٠١٠ز

بسم الله الرحمن الرحيم

زنجيره كتێبی نواڵەی نوێ ژماره( ١٢٤ )

خاوەنی ئیمتیاز هۆشیار نوری لەك

سەرنوسەر ئاری ئاغۆك

پێناسی كتێب



ناوی كتێب : دڵخۆشم

نووسینی : بڕوا موحەممەدی

دیزاین : عزالدين عبدالله

تایپ : فلاح

داڕشتنی بەرگ : چاپخانەی گوڵ

نۆرەی چاپ : یەكەم( ١٤٣١ك، ٢٠١٠ل )

تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانه

چاپ : چاپخانەی ( گوڵ )

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی (٤٥)ساڵی (٢٠١٠) دراوەتێ



بەهاوكاری سەنتەری رۆشنبیری بەهرە بەچاپ گەیەندراوە



بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی :

بۆ زانایانی ئیسلام، بۆ بەرێوە بەرانی پەروەردە و فێرکردن، بۆ دەزگا بەرپرسەکانی میری، بۆ دایکان و باوکان، بۆ منداڵان، هیوادارم هەمووماں بە خوێندنەوەو تێڕامان لەم هۆنراوانە گەشە بەبیرکردنەوەو وتەو کارەکانمان بدەین و نەوەیەکی تەندروست و ساغ، بۆ بەرێوەبردنی کاروبارەکانی مرۆڤایەتی بەرهەم بهێنین .


بروا موحەممەدی


١٥ / شەعبان / ١٤٣٠ك

چوارشەممە ٥ / ٨ / ٢٠٠٩ ل



**پێشکەش بێت** / بە منداڵانی خۆشەویست، بە دایکان و باوکان، بە خوشکان و برایان، بە قوتابییان و مامۆستایان، بە هاووڵاتیان و حکومەت .



# حـــەزدەکەم

حەزدەکەم، هەموو، خەڵکـان
وەك، جوانن، جـوان، بـــن
بـــە، ڕەوشـــتی بـــــەرزەوە
قسەخـــۆش و نیـــان، بـــن

لەگەڵ، یەکدی، بە، جـــوانی
هەڵسوکـــــەوت، بنوێنـــــن
بـــە، دڵپـــاکی و دڵـــسۆزی
یەکـدی. .یەکـتر. .بـــدوێنن

چونکە، خووی قسە خـــۆشی
مـــایەی سەرنـــجی جـــوانە
حـــەز، پێــکتر، دەســازێنێ
لەم، ژیـــانەی جیهـــانە

کەواتە، بـــا، تێکـــــۆشین
لەگەڵ، یەك، قسەخۆش، بین
لەگەڵ یەك، بـــۆ، یەکـــتری
دڵسۆز، بین و پەرۆش، بـــین





هەینی / ٣ / صەفەر / ١٤٣٠ك
٣٠ / ١ / ٢٠٠٩ ل



## ددانم خاوێنه



تەماشای نێو، دەمم، کەن
پڕ، لە، ددانی جوانە
پارچەك، گۆشتی تێدایە
ئەویش، ناوی زمانە

ها، سەیر،کەن، ددانم
چەندە، سپی و خاوێنە
گەر، ئێوە، زارۆی چاکن
بۆم، ببن، بە، ئاوێنە

بەڵێ، من، خووم، پێگرتووە
ددانەکانم، دەشۆم
پاککردنەوەی پێویستە
چونکە، من، خواردن، دەخۆم

ئەوەش، بۆ، تەندروستیم
زۆر، چاك و باش و خۆشە
ئەوەی بیر بکاتەوە
وەك، من، نیوها[1]، پەرۆشە

هەینی / شەموو / ٣ ، ٤ /سەفەر / ١٤٣٠ك
٣٠ ، ٣١ / ١ / ٢٠٠٩ز

---

[1] نیوها : ئەوها ، وەها ، وا ، هۆسا ، ...



# لەچوارلای سفرەی نان دا

منـــــدالآن، وا، دانیشتـــوون
لە، هەر، چوارلای سفرەو خـوان [1]
چاوەڕێی خـــواردن، دەكـــەن
بە، دیـــمەنێكــی جـــوان



وا، دایكیان، خواردن، دەبـــات
یەك..یەك..بۆیان، دادەنــێ
هەموویان، هێمنانـــەنـــە
بێ هەران، دەستتـــــادەنێ

جا، پاش، دانـــــانی خواردن
دایكیان، گاس، دەكـــاو دەڵێ
وەرە، باوكی منـــــــدالآن
ئـــەویش، دێت، دەڵێ.. بەڵێ

[1] خوان : سفرە



جا، به ( بسم الله ) گشتیـــــان
دەست، بە، نـــان خواردن، دەكەن
بە، ئاكاری ڕێك و جـــــــــوان
دەست، لە، بۆ، خـــواردن، دەبەن

پـــــاش، ئـــــەوەی لێبوونەوەش
دەڵێن، ســــــوپاس ( خوایەگیان )
بە، گـــــورج و گۆڵی دەچـــــــن
دەشـــۆن دەســـــــت و دەم و دان[2]



شەموو / ٤ / صەفەر / ١٤٣٠ك
٣١ / ١ / ٢٠٠٩ز

---

[2] دان : ددان ، دران




منداڵێك، لەگەڵ، باوكی
چوو، نوێژ، لە، مزگەوت، بكات
چاوەڕوان بوو، تا، بانگدەر
بانگێك، بە، جوانی بدات



كە، گوێی لە، بانگدەر، ڕاگرت
بانگدەر، دەنگی خۆش، نەبوو
زانی، دڵ، ناهەژێنێ
بۆیێ، پرسیاری هەبوو

پاشان، نوێژی خۆیان، كرد
بە، ڕیزێكی خوار و خێچ
بڕیاری دا، پرسیار، كا
لە، باوكی بێ پەناو پێچ

كاتێ، بۆ، ماڵەوە، چوون
بە، باوكی بەڕێزی ووت
گوتی: ببوورە، بابە
گەر، پرسیار، دەكەم، لە، ڕووت



باوکیشی گــــوتی کــــوڕم
فەرموو، چیت، هــــەیە، بـڵێ
گـــــەر، داوای وەڵام، دەکـــەی
منیش، پێت، دەڵــبـێم، بەڵــێ



کوڕەش، گوتی باشت، بــیـــست
بۆ، بانگدەر، دەنگ، ناخۆش، بوو؟
ڕیزی نـــــوێژخوێنانت، دیـــت
بۆ، خوارو نێوان، بــۆش، بـــوو؟

کوڕەکەم، تۆ، ڕاست، دەکــــەی
دەبێ، بانگدەر، دەنگ خۆش، بــێ
بـــۆ، ڕیزی ڕاست و جـــوانیش
دەبێ، نوێژخوێن، بەهـــۆش،بێ

شەموو / ٤ / صەفەر / ١٤٣٠ك
٣١/ ١/ ٢٠٠٩ل



# لە سەردانی ماڵێکدا





شەوی هەینی / ٩ \١٠ / صەفەر

١٤٣٠ك

٥\ ٦ / ٢ / ٢٠٠٩ل

من، لەگەڵ، دایکی خۆمـــدا
چووم، بۆ، ســەردانی مــاڵێك
پاش، پێشوازی و دانـــیشتن
خۆم، ناساند، بە، منداڵێك

جا، لەگەڵ یەك، ڕێککەوتین
پێکەوە، یاری بکـــــــەین
بە، هیچ، جۆرێك، نەخوازین
ئازاری یەکـتر، بــــدەین

وابوو، تا، هەستاین، ڕۆیین
بە، خۆشی یاریمان، کـــرد
ژیکەلانە، پێکــــــــەوە
خۆمان، لێکدی زیز، نەکـرد

پاشان، لەگــەڵ، دایــکمدا
لە، بۆ، ماڵێ، چـــووینەوە
لەم، سەردانەی کـــــردمان
پەشیمان، نــەبــووینەوە

# باوكم دیاری بۆ كڕیم



ئەمڕۆ، بـــاوكی بـــەڕێزم
دیارییەكی بۆ، كـــــڕیم
ئاشتبوومەوە، لــەگـــەڵی
كە، دونێ، بـــۆی نەكــڕیم

تەماشاكەن، چەند، بـــاشە
سەببووڕەی بۆ، هێنـــــاوم
ڕێنووسی لەسەر دەكـــــەم
بـــاوكم، ڕێزی لێنـــاوم

كەواتە، بـــاوكی خـــۆمە
جێگـــەی سوپـــاس و ڕێزە
خاوەن، بەڵێنی خـــۆیتی
خۆشەویستەو بـــەڕێزە

جا، جارێكی دی هەرگـــیز
لە، باوكم، تووڕە، نـابـم
گوێڕایەڵی دەنـــــوێنم
چونكە، بـابمە بـــابم

هەینی / ١٠ / صەفەر
١٤٣٠ك
٦ / ٢ / ٢٠٠٩ز

# سەوزەوات کڕین

دایکم، پێی گوتم، کــــوڕم
بڕۆ، سەوزەوات، بــــکڕە
بەڵام، ئاگات، لێ بێ، ئــی
پووت و تولخاوە، مەکــــڕە

منیش، پارەم، لێی وەرگـرت
ڕۆیییشتم، بەرەو دوکـــــان
ئەوەی پێی گوتم، کــــڕیم
وەك، تەمــــاتەو باییبنجان

کە، گــەڕامەوە، مـــاڵێ
دایکم، سوپــاسی کـــــردم
گوتی کــــوڕم، ئافــەرین
کوڕی بـــوێرو مـــەردم

جا، من، بەو، قــسەی دایە
دڵم، ئاسوودەو خــۆش،بوو
پێم گوت، سوپاس، بۆ ( خودا )
کوڕت، ئازاو بەهــۆش، بوو





یەکشەم / ١٢ / صەفەر / ١٤٣٠ك

٨/ ٢/ ٢٠٠٩ل

# چەندە دڵخۆشم

چەندە، شادو دڵـــــخۆشم
کاتێ، دایکم، پێـــم دەڵێ
کچم، یارمەتیم، بـــــدە
منیش، پێی دەڵێم، بـــەڵێ

دایکم، دەزانێ، چـۆن چۆن
بانگم، بکاو بمـدوێـــنێ
بۆ، گوێڕایەڵیم، لە، بـۆی
ڕێك و پێك، بـــمبزوێنێ



فێـری کردوومە، کـــاتێ
بەگوێی داوبابە[1]، بکـەم
خۆشەویست و شـاد، دەبـم
بە، بەهەشتی( خوا ) دەگـەم

---

[1] داوبابە : دایەو بابە

منیــش، متوو و پـــابەندم
بـە،وتەی چاك و نیـــانی
دڵی هەرگیــز، ناشکـێنم
بە، گوێی دەکەم، بە، جوانی



سێشەم / ١٤/ صەفەر / ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٢/١٠ل



# با نوێژ بکەین

دەبا، هەموو، نوێژ، بـــکەین
منداڵانـــی قشت و جـــوان
گوێڕایەڵ و هــۆگــر، بـــین
بۆ، ڕەحمەتی گشت، جـــیهـــان



ڕەحمەتـــی گشت، جیهـــانیش
موحـــەممەد، مـــوستەفـــایە
بۆ، هەمـــوو، مـــــرۆڤێتی
دڵـــــسۆزو بـــە، وەفـــایە

ڕێنمای پەخـــش، کــــــردووە
کە، منداڵ، بوو،بە، حەفت،ساڵ
دەبێ، فێری، نوێژ، بکـــــرێ
تا، بە، نوێژ، بـــبێ خۆشحاڵ

کەواتە، با، خۆشحـــــاڵ، بین
بە، نوێژ، بـــۆمە، ژیـــانە
نوێژکردن، هێمـــای بـــڕواو
پارێزی لاشەو گـــیانـــــە

جا، با، خۆمان، خۆش، بـــوێ
خۆمان، فێره، نوێژ، بـــکەین
بۆ، بەهەشتی خوای گـــەوره
کاربکەین، هەوڵبـــدەین





پێنجشەم / ١٦/ صەفەر/ ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/١٢/١٢ز



## کچێکی جوانم



سێشەم / ٢١/ صەفەر/ ١٤٣٠ك
١٧/٢/٢٠٠٩ل

من، کچێکی جــــوانــــم
جوانی خــۆم، دەسەلمــێنم
یــارمەتی دایـــکم، دەدەم
گــوێڕایـــــەڵی دەنـــوێنم

کە، دایکم، دەڵـێ، کـــچم
هەردەم، ڕاستگۆیە، ڕاســتگۆ
منیش، دڵی خۆش، دەکـــەم
دوور دەکـــەوم، لـــــە درۆ

کاتێ، دەڵێ، کـــچی خـۆم
بخوێنە و ســـەرکەوتوو، بی
منیش، دەڵێم، زۆر ســوپاس
تۆش، شادو لێهاتوو، بـــی

کاتێك، پێم دەڵێ، هەســتە
گێسکەك، لە نێو ماڵ، بــدە
منیش، دەڵێم، سەر چـــاوم
تۆ، بڵێ و فەرمان، بـــکە

# من هاوڕێی هاوڕێی چاکم



چوارشەممە / ٢٢/صەفەر/ ١٤٣٠ك

٢٠٠٩/٢/١٨ز

من، هاوڕێ ی هاوڕێ ی چاکم
هاوڕێ ی چاکم، خۆشدەوێ
چونکە، هەر، هاوڕێ ی چاکە
کە، هاوڕێ ی خۆی خۆشئەوێ

دایبابم، پێیان گوتم
کە، هاوڕێ ی چاك بم
هاوڕێیان پێم، دڵشاد بن
دەستپاك، بم و دڵپاك، بم

منیش، شادم، هۆگرم
بە، ڕێنوێنی دایبابە
چونکە، ئامۆژگاری وان
بۆ، من، جوانی و نایابە

کەواتە، من، هیوامە
منداڵان هاوڕێ ی چاك، بن
هۆگر، بن، بە، وتەی باش
لەگەڵ یەك، باش و پاك بن




مندالینە (خوا) گیانە
بۆ، ئێمە، میهرەبانە
ئێمەی دروست کردووە
بەم، شێوەیە، جوانە

هێزو ڕۆزی بەخشەرە
(دین)و(عەقڵ) پێدەرە
توانای بەسەر، ژینمانە
(خالق)ی بوونەوەرە



جا، ئەوەی ئەو، دایناوە
لەسەر، ئێمە، تەواوە
چەند، پابەندی ڕێ ی ئەو، بین
ڕێك و باش و شیاوە

سێشەم / ٢٨/صەفەر/ ١٤٣٠ك
٢٤ /٢/ ٢٠٠٩ل

کەواتە، با، هەوڵدەین
برەو، بە، چاکە، بدەین
تا، لە، دونیاو قیامەت
دڵخۆش بین، قازانج بکەین






من، منـــــدالێکـــی قشتم
خۆشەویستی ماڵی خــــۆم
گوێڕایەڵی دایـــابــــــم
بە،دەستی ڕاست، نان، دەخۆم

لە، ماڵێ و قـوتابخـــانە
هێمنی دەپـــارێـــزم
تێدەکۆشم، ڕێکـــتربــــم
مرۆڤم، من، بـــەڕێـــزم

پاك و بەڕەوشت، دەبـــم
هەوڵدەدەم، زیرەك، بـــم
بە، دڵسۆزی و بەچـاکـــی
دەکۆشم، بە، ئەمەك، بـــم

بەڵێ، من، وەك، منــداڵێ
گوێڕایەڵی دایـــبابـــم
دەخوازم، پێشکەوتوو، بـم
جێ ی ڕەزامەندی خـوا بـم



یەکشەم / ٤/ ربیع الاول / ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/١ل



# دایک و باوکم ئازانه

دایك و باوكم، ئـــازانـــه
منیان، باش، ڕاهـــێناوه
بۆ، ئەوەی فێره، نوێژ، بم
هەوڵیان، لەگەڵمـــا، داوه

تاكو، بزانم، نـــوێژه
بنـــاغەی بـــــڕواداری
بە، نوێژكردن، دووركـەوم
لە، خـــــرا پەو زۆرداری



منیش، ئێستا، نوێژ، دەكەم
نوێژێك، كە ( خوا ) دەیـەوێ
بە، نوێژكردن، جـــوانم
دڵیشم، پێی دەســــرەوێ

دووشەم / ٥/ربیع الاول/ ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/٢ز

جا، دابابـــان، مـــندالان
ئێوەش، وەك، ئێمە، بكەن
نوێژ، بیلبیلەی چاوتان، بێ
بە، نوێژكردن، تێـــدەگەن



# چەندخۆشە منداڵەکان

چەندخۆشە، منداڵەکـــــان
قسەخۆش و ڕووخۆش، بیـــن
بۆ، ڕێك و پێکی، لە، ژیـــن
دڵسۆزو ،بە، پەرۆش، بـــین



چەندخۆشە، منداڵەکـــــان
قسەڕاست و ڕاستگۆ، بـــــین
بۆ، تەبایی و ئارامـــــــی
دڵپاك و بێ درۆ، بـــــــین

چەندخۆشە، منداڵەکـــــان
خاوەن، هەرێ و پەیمان، بین
بە، کرداری باش و چـــــاك
ڕەوشت و ئاکار، جـوان، بین

چەندخۆشە، منداڵەکـــــان
بێ دەعیە و لاف و فیز، بـــین
بە، دڵ و چاوو دەستـــــمان
پاك و چاك و تەمیز، بیـــن



چەندخۆشە، منداڵەکـــــان
ئەرك و مافمان، بـــــزانین
لە، کـــاروبـــاری ژیـــــان
هەستیار، بین و هۆشیـار، بین

چەندخۆشە، منــــداڵەکـــان
خۆشی یەکدیمان، بــــوێ
بۆ، ئـــارامی دەروونـــــمان
هەر، خۆشی خۆمان، نـــەوێ

چەندخۆشە، منـــــداڵەکـــان
ئەوەی گوتمان، ئـــاوا، بـــین
تـا، ئەم، ژینە، جێـــدێڵین
جێ ی ڕەزامەندی ( خوا ) بـــین

چوارشەم / ٧/ربیع الاول / ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/٤ل



## گومانی جوان



هاوڕێکەم، هەرێ[1] ی پێــدام
نازانم بۆچی نــەهـــات؟
جارانی تر، وانــەبـــوو
لە، کاتی خۆی دا، دەهـــات

منیش، چابوو، گومـــانــم
باش بوو، بە،باشـی پێــبرد
سوپاسی ( خودا ) دەکـــەم
خۆم، توشی، گوناح، نەکــرد

چونکە، من، گـوشکــراوی
ئامۆژگاری ژیـــانـــــم
بە، گوێ ی پێغەمبەر ﷺ دەکەم
بۆیە، جوانە، گومـــانم

تێدەکۆشم، لــە، ژیـــان
هیچ، کەس، ناشرین، نــەکەم
بە، گومانی چاك و جـــوان
چاك بم و خزمەت، بکـــەم

---

(1) هەرێ : پەیمان ، بەڵێن




ناگەڕێم، بە، دوای هەڵەی
خوشك وبرای موسڵـــــمان
چونکە، خۆ، موسڵـــمانە
ئیشی جوانە جـــــوان

جا، منیش، موسڵمـــــانم
نابێ، کاری وا، بـــکـەم
خۆم دەپارێزم، بە (خـــوا)
کاری وا، ئەنجام، بـــدەم

من، خۆ، هێشتا، منـــداڵم
بەڵام، داییابم، دەڵێـــــن
بە، دوای هەڵان، مەگـــەڕێ
پێمان، دە[1]، بەڵێن بـەڵێن

منیش، بەڵێـــــنم، داوە
بە، داییابی بــــــەڕێزم
بە، دوای هەڵان، نەگـــەڕێم
بەخوا، خۆم بپـــــارێزم



یەکشەم / ١١/ربیع الاول/١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/٨ز

[1] دە : بدە



# دایکم

دایکم، پێم دەڵێ، کـــوڕم
گوێ، لە، دایبابت، بـگرە
ئێمە، بۆ، تۆمانە تــــۆ
ئامۆژگاریمان، وەرگــــرە



منیش، دەڵێم، سەرچـــاوان
دایکی چاك و، بە، ســـۆزم
چۆن، ئێوە، بۆم، دڵســـۆزن
منیش، بۆتـان، دڵســـــۆزم

دایکم، دەڵێ، کوڕی خـــۆم
ڕەوشت باش و ڕووخۆش بــە
لە، وتەو کرداری خــــۆت
چاکبەو، بە، هەست و هۆش بە

منیش، دەڵێم، دایکی خــۆم
سەرچاو، گوێڕایەڵتانــــم
بە، پەروەردەی جوانتـــانە
من، کوڕی زیتەڵتـــــانم

دایکم، دەڵێ، ئافـــــەریـــــن
لە، ڕاست، من(خوا) لێت خۆش، بێ
لە، دونیا و لە، قیـــــامـــــەت
ژیانت، باش و خـــــــۆش، بــێ

پێنجشەم/١٥/ربیع الاول/١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/١٢ز



## دڵخۆشم

دڵخۆشم، کاتێ دایـــــــکم
پێم دەڵێ، لێت، ڕازیـــــــمە
دوعاو نزای ئەو، بۆ، مـــــن
جێی شادی و شـــانازیمـــــە

چونکە، من، وا، ڕاهاتـــووم
بە، پەروەردەی ڕێك و جـــوان
بێ ئوف، گوێڕایەڵی کــــەم
بۆ، دڵسۆزم، دایە خـــــان



چونکە، دەزانم، باشبـــــوون
لەگەڵ، دایە، پێویســـــــتە
( خوا ) ئایەتی فەرمـــــووە
فەرمانی خــــۆشەویستـــــە

جا، من، گوێڕایەڵ، دەبـــم
بە، پێی ( ئایە ) و ( فەرمووده )
دڵی دایکم، ناشکێـــــــنم
بۆ، من، چاکەو، بە، ســـووده

تاکو، بە، دوعـــــای دایە
(خودا) بۆ، بــەهەشت، بمبات
لە، دونیا و قیـــــامـەت دا
سەربەرزو ڕوو سپیم، کـــات



پێنجشەم، هەینی/١٥، ١٦ /ربیع الاول/١٤٣٠ك
١٢، ١٣ /٣/٢٠٠٩ل






منداڵ / خاڵە، بمدێ، چشتم، دێ
چشتی خراپم، مەدێ

دوکاندار / فەرموو، حەزت، لە چی یە؟
دەڵێ ی پارەت، پێ نی یە؟

منداڵ / ئیف[1]، کوو[2]، پارەم، پێ نی یە؟
ها، ئەدی، ئەمە، چی یە؟

دوکاندار / دەی، باشە، عاقڵ، بێنە
شت، هەگرە([3])، دامەمێنە
لەم، شتانە، زووبە، دەی
باشە، شت، بۆ، خۆت، ببەی

منداڵ / لێم گەڕێ، خاڵە خاڵە
پەلە مەکە، ئەوهاڵە[4]
ئێستاکە، چشتێ، دەبەم
ئا، لەم، کێکە، حەزدەکەم

---

[1] ئیف : قسەیەکی منالانە بۆ بەرپەرچ دانەوە و ناڕازی بوون بەکار دێت .
[2] کوو : چۆن ، چلۆن ، چەوا
(٣) هەگرە : هەڵگرە ، هەڵبگرە
[4] ئەوهالە : ئەوها ، وەها



دوکاندار /  ئافەرین ئەوجا، چیدکە؟
حەزدەکەی، ببەی ئیدکە؟

منداڵ /  نا، خاڵە، چیدکەم، ناوێ
قسوریەکەم، بۆ، بـــاوێ



دوکاندار /  ها، قسوریەکەت، وەرگرە
جا، ڕێ ی ماڵێتان، بگرە

منداڵ /  سوپاس ، خاڵە( خواحافیز )
ئەی دوکانداری بێ فـــیز

دوکاندار /  خوات لەگەڵ بێ، ژیکەڵە
ئەی قشتیلە و زیتـــەڵە

دووشەم/ ١٩/ربیع الاول/١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/١٦ل



## ئەی بابە زگم دێشێ

منداڵ / ئەی بابە، زگــم، دێشــێ
وەرە، بە، فریام، بــــگە
چیم، لێدەکەی زووبــە، دەی
زۆر، دێشێ، چارەم، بکـــە



بابە/ ئەدی من، پێم، نەگۆتـــی
ڕۆڵە، ئاگات، لە، خۆ، بـــێ
خواردن، ئەوها، زۆر، مەخـۆ
تـا، زگت، پڕ، ئێش، نەبــێ

منداڵ / ئێ چبکەم، حـەزم، لێــبوو
بە، نەفسی خۆم، نەوەستام
جارێکی تر، وانـــــاکـەم
ئەمجارە، بگە، فـــریـــام

بابە/ باشە، ڕاوەستە، ئێســــتا
دوعات، لە، بۆ، دەخوێــــنم
ئەگەر، چاك، نەبـــوویەوە
دەرمانت، بۆ، دەهێــــنم



منداڵ / سوپاس، بابه، به، دوعات
به، باشی باشبوومـــــهوه
هێش، له، زگم دا، نـــهما
بێ ( شروب ) چاش بـــوومهوه



بابه / ڕۆڵەی خۆم، جـــارێکی دی
وا، چاك و باش و جـــوانه
ئەوها، زۆر، نەخۆی، نـــەکو
بکەویە، خەستەخـــــانه

منداڵ / بەڵێ، بابه، چیدیـــــکه
خواردن، ئەوها، زۆر، ناخۆم
خۆ، بۆ، من، ڕوون و دیـــاره
که، ئێش و ئازاربوو، بـــۆم

بابه / ئافەرین، ڕۆڵەکەی خـــۆم
ئەوها، بکـــەی زۆر، چـــاکه
باشه، بۆ، تەنـــدروستیت
ڕێی پێغەمبەری پـــــاکه

چوارشەم /٢١/ربیع الاول/١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/١٨ز



# له یادی (مەولود) دا

لە، ڕۆژی لە، دایك بـــوون
لە، مەولودی پێغەمبـــەر
خەڵكان، صـەڵاوات، دەدەن
لە، چاكترینی بەشـــەر



بەخشینی شیریـــنی یـــە
لە، مزگەوت و لە مـــاڵان
بۆ، مەولود، خڕدەبنـــەوە
پیاو ، ژن و منـــداڵان

خۆشی خۆیان، دەردەبـــڕن
بە، هاتنی ئەم، یـــادە
ڕۆژی لە، دایك بوونـــی
ڕابەری ئـــادەمـــزادە

بەڵام، من، وەك، زارۆی كـورد
بـاوكم، وای ڕاهێنـــامـــە
گشت، ڕۆژێ خـۆشم بـــوێ
ڕابەری ئەم، ئیـــسلامـــە



جگـــــە، لە، ڕێبازی ئـەو
ڕێی تر، بە، ڕاست، نەزانم
لە، صـەڵاوات، تێبگـــەم
واتاو چەمکــی بزانـــــم

منیش، ئێستا، دەزانـــم
لە( صەڵاوات ) تێدەگـــەم
پێغەمبەرم خۆشـــــدەوێ
پەیڕەوی ڕێگەی دەکـــــەم



شەموو ، یەکشەم / ٢٤، ٢٥ / ربیع الاول/ ١٤٣٠ك
٢١، ٢٢ / ٣ /٢٠٠٩ل

# شتی کەس ناهێنمەوە

باوك / كوڕی خۆم، خۆ، پێم گوتـــی
كوڕێكی باش و چاك، بـــــه
شتی كەس، مەبە .. مەبـــــه
دەستپیس، مەبەو دەستپاك، بە



كوڕ / ئە مجارەیان، نەمــــزانی
لێم ببوورە، باوكی خـــــۆم
جارێكی تر، وا نـــــاكەم
سەرنج، بدە، چەند، ڕاستگۆم

باوك / ئاخر، كوڕم، كوڕی خـــۆم
من، خۆشی تۆم، مەبـــەستە
ئەوەی كردووت، گـــوناهە
وەرە، باوەشم، هەســـتە

كوڕ / چی بابە، چی، گـــوناهە؟
گوناه، چــــی یە؟ پێم بڵێ
تا، چیدی، ئەوها، نەكـــەم
ئا، بەڵێ، بابە، بــــەڵێ

باوك / كوڕم خــۆ تـــۆ دەبینی
ئێمە كاتێ نوێژ دەكـــەین
نوێژ دەبێ وامان لێكـــات
كەكاری خراپ نەكەیـــن



باوك / چونك (1)، ئەوەی تۆ، هێناوتە
ئی تۆ، نییە و هی خەڵـــكە
خوای گەورە، پێی ناخـــۆشە
بۆت، حەرامەو بێ كـــەڵكە

كوڕ / جا، باشە، بابە، تـــەواو
مادام( خوا ) نـــاڕازی یە
واناكەم، بە، گـــوێت، دەكەم
بۆ، من، جێ ی شـــانازی یە

سێشەم / ٢٧/ربیع الاول/ ١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/٢٤ز

---

(1) چونك : چونكە ، چوكە



# ئامۆژگاری دایبابە

ئامۆژگاری دایبابە
کە، ئەم، وەکی، برا، بین
خۆشی یەکترمان، بۆ
دگەل، ئێکدی، تەبا، بین



پێمان، دەڵێن، ڕۆڵەکان
تنێ[1]، عەبدێ (خودێ) بن
تا، لە، ژینتان، سەرکەون
قەسە، قەنج[2] و کارچێ، بن

ئەم ژی، وەك، زارۆکێن، زیخ[3]
بە، گوێ ی، داییا بمان، دەکەین
چونکی[4]، دڵسۆزێن، مەنە
بێ ئوف، یارمەتی یان، دەدەین

---

(1) تنێ : تەنێ ، تەنیا
(2) قەنج : جوان
(3) زیخ : زیرەك
(4) چونکی : چونکە ، چونکو

چونکو، چیٚ بوون، دگەل، وان
بۆ، مە، سەربەرزی و چاکـــە
گوهداریا، داییابـــــــانە
ڕەزامەندی خوای تـــــاکە

سیٚشەمبی/٢٧/ربیع الاول/١٤٣٠ك
٢٠٠٩/٣/٢٤ل

